# مەرجەکانی

# لا إله إلا الله

ڕاڤەکردنی

ماموٚستا کامەران کریم رحمه الله

نووسین و ئامادەکردنی

شیخ موصعب

**بسم الله الرحمن الرحيم**

## پێشەكی:

بسم الله الصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وأصحابه ومن اهتدى بهداه،

خوای تبارك وتعالى لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووی : (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ)[1] زانایان دەفەرموون رحمەتی الله یان لێ بێ خوای تعالى داوای كردووە لە مخلوقات كە ئەبێت هەموویان زانیاریان هەبێ بەوشەی (لا اله الا الله)ئەگەر زانیاریت نەبێت بەم وشەیەوە و بێتە ناو ئەم دینەوە بەبێ ئەوەی بزانی واتاكەی چیە ئەوە تۆ نەهاتویتە ناو دینەكەیەوە ، سەیری ئایەتەكە بكەن الله تعالى دەفەرمووی : (فَاعْلَمْ)ئەوە فیعلى أمرە یانی بزانە . چی بزانین یا الله ؟ (أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ)بەتەئەكید هیچ كەسێك نابێ بەقسەی بكرێی نابێ عیبادەتی بۆ بكرێی إلا الله نەبێ سەرلەبەری قورئان هەمووی باسی ئەم وشەیەیە قورئان هەمووی لەبەر خاتری ئەم وشەیە هاتۆتە خوارەوە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)هەموویان لەبەر خاتری ئەم وشەیە نێردراون جن و ئی[2]نس هەمووی لەبەر خاتری ئەم وشەیە دروست كراوە .

ئینجا لێرە ئاماژە بەوە ئەدەین كەوا زۆر كەس وا تێگەیشتووە كە ئەلێ ئەگەر پێغەمبەر نەبووایە (صلى الله عليه وسلم)خوا دونیا دروست نەئەكرد وە زۆر جار ئەمەمان گوێی لێ دەبێت حەدیسێكی مەوزوع ئەهێنەوە كە دروست كراوە و پێغەمبەر نەیفەرمووە (صلى الله عليه وسلم) ئەلێن (لولاك ما خلقت الأفلاك)[3]ئەمە حەدیسێكی درۆیە بەزمانی پێغەمبەرەوە دروست كراوە (صلى الله عليه وسلم)واتا ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئەی محمد من كەون و كائیناتم دروست نەئەكرد ! هەمووی لەبەر خۆشەویستی تۆ دروستم كردووە ئەم قسەیە هەلەیە هەرخودی قورئان بەدرۆیی ئەخاتەوە .

---

[1] :سورة محمد اية :١٩

[3] : في "السلسلة الضعيفة" (٢٨٢) : موضوع اهـ

الله تعالى دەفەرمووی : (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[4] واتا من جنۆكە و ئینسانم دروست نەكردوە تەنها بۆ عیبادەت كردنی من نەبێت تەنها بۆ ئەوەی من بەیەك بزانن وە عیبادەتی یەكخوا بكەن بەقسەی یەك خوا بكەن ، ئەگەر بەقسەی كەسێكیترت كرد كە قسەكەی پێچەوانەی مەنهەجی خوا بوو ئەوە كردت بە دوو خوا ! ئەگەر بەقسەی كەسێكترت كرد ئەوە دەبێ بە سێ خوا ئەبێ بەچوارو پێنج و هەتا دوایی ، وەكو ئێستا دەبینین خواكان زۆر زۆرن ، خوای گەورە لەقورئاندا باس دەكا ئەلێ كاتێك كە پێغەمبەر هاتە لایان (صلى الله علیە وسلم)بۆ قەومی قوریش كە خوایان ئەپەرست بەلاَم لەگەل خواا چەندەها شتیتریشیان ئەپەرست و عیبادەتیان بۆ ئەكردن وتیان قوریشیەكان : ( أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ)[5]چۆن محمد (صلى الله علیە وسلم) دێت بەئێمە دەلێ دەبێت  تەنها خودا بپەرستین نابێ شتیتر بپەرستین نابێ بەقسەی شتیتر بكەین و شوێنی شتیتر بكەوین نابێ ئەوەی كە خۆمان هەلمان بژاردوە و بەباشی ئەزانین شوێنی بكەوین چۆن ئەبێت وابێت ئەمە شتێكی زۆر عەجائیبە ؟!خوای تعالى رەدی دایەوە لەم ئایەتەدا و ئەفەرمووێ :ئەو بۆیە هاتووە بۆ ئەوەی تەنها یەك خوا خوا بێت نابێ كەسیتر خوا بێت ،

جا لێرەدا ئەمەوێت بێمە خزمەتان باسی ئەو مەرجانە بكەین كە تۆی موسلمان پێ بویت بەموسلمان كە (لا اله الا الله)یە مەرجەكانیشی بریتین لە حەوت بۆ هەشت مەرجێك{وەزانراویشە كەوا كلیلی دەرگای بەهەشت بریتیە لە (لا اله الا الله)وە بۆچونەوە ژوورەوەی ئەم دەرگایە كە داخل بوونی بەهەشتە پێویستە تۆ ئەم كلیلەت پێی بێت بۆئەوەی بچیتە ژوورەوەی و دەرگاكە بكەیتەوە وە روونیشە هەموو كلیلێك ددانی هەیە وە ئەم ددانی كلیلی ئەم (لا اله الا الله)بریتیە لە مەرجەكانی وە پێویستە ئەم مەرجانە بزانی و لەژیاندا جێ بەجی بكەین بۆ ئەوەی دەرگاكە ببێتەوە ئەگەر نا دەرگاكە نابێتەوە هەرچەند تۆ كلیلەكەش بخەیتە نێو دەرگاكەوە}

[4] :سورة الذاريات اية : ٥٦
[5] :سورة ص اية: ٥

# مەرجەكانى (لا اله الا الله)

## یەكەم مەرج بریتیە لە زانین:

مەرجى یەكەمى ئەم (لا اله الا الله) تۆ بزانى ماناى ئەوە چیە وە (لا اله الا الله)یانى هیچ خوایەك شایستەى پەرستن نیە هیچ بەردێك هیچ دارێك هیچ بۆچونێك هیچ فەسلەفەیەك هیچ رێبازێك هیچ داواكاریەك لەخەلكى لە مردوان و زیندووان ئەمانە هیچى جائیز نیە و شەریك پەیا كردنە بۆ خواى گەورە نابىَ بۆ هیچێك لەمانە بێت بەلكو دەبێت تەنها بۆ الله بێت .

لا : نەفى یە تۆ ئەلێت نەخێر (لا اله)نەخێر بۆ هەموو ئیلاهێك (الا الله)تەنها بۆ الله.

جا ئەگەر ئەم مانایە بزانى یەكەم مەرج كە داوات لىَ ئەكرێت تۆیىَ موسلمان بى مەرجمان لەگەلت هەیە كاتێك دێتە ناو حیزبەكەى خواوە بەلىَ حیزبى خوایە هەروەكو خواى تعالى لەقورئاندا دەفەرموویێ : (أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)[6] حیزبى شەیطان خاسیرە تۆ دێتە ناو حیزبەكەى خوا ! وە ئەم حیزبەى خوا كامەیە ؟ چونكە خواى گەروە قورئانى ناردوە وە پێغەمبەرى ناردوە (صلى الله علیه وسلم)ئەوەى پىَ ناردوە . خواى تعالى ئەفەرموویێ من مەرجم هەیە لەگەلت بەبىَ مەرج من وەرت ناگرم و قبولت ناكەم و بەموسلمانت حیساب ناكەم ، راستە كە سەیرت دەكەى بەخۆت ئەلێت موسلمان بەس ئەبێت ماناى موسلمان بزانى یانى بەتەواوى تەسلیم بووم بە خوا تەسلیم نەبووم بەكەسیتر تەنها لەگەل خوادام و لەگەل كەسیتردا نیم .

(العلم المنافي للجهل) یەكەم مەرج ئەوەیە كە الله تعالى لێت قبول ناكا بەبىَ زانین هەروەكو الله تعالى فەرموویەتى : ((فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ)[7]ئەبێت زانیاریت بەماناى (لا اله الا الله)بزانى بەكوردى واتاى چى .

---

[6] سورة المجادلة اية :٢٢

[7] سورة محمد اية :١٩

زانایان دەفەرموون (العلم بمعنا لا الة الا الله نفیا وإثباتا)دووشتت لێرەدا دانا نەفی شتێكت كرد وە دانت بەشتێكیش دانا . بەكورتیەكەی دەلێت نەخێر بۆ هەمووواو بەلێ بۆ خوا .

ئایا واقیعی ئێمە ئەمرۆ وایە ؟یاخود بە پێچەوانەوە وەیە كە ئەلێن نەخێر بۆ الله بەلێ بۆ هەمووان ! دە بە الله تۆ نەچوویتە ناو دینی ئیسلامەوە ئەگەر وانەلێت .

ئایەتەكە سەریعە ئەلێ ((فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ))[8].

## دووەم مەرج بریتیە الیقین :

ئەبێت دلنیابیت لە ١٠٠٪ نابێت یەك نەزەرە شك و گومانت هەبێ ، شك و گومانت هەبێ لە ئاخیرەت كافری ، با خواش بپەرستی شك و گومانت هەبێ لە راستیەتی ئەم دینە ئەوە تۆ كافری ، وەكو ئەوەی بلێ من شوێنی دەكەوم ئەگەر راست بوو ئەوە سەربەرز دەبین ئەگەر راستیش نەبوو ئەوە خۆ هیچمان لەدەست دەرناچێ ! ئەمە گومانە نابێت .

بەلكو دەبێت بلێ ئەبێ الله تعالی بپەرستێ ئیمانم هەیە كە هەیە ئەیپەرستم و بەهەشت و جەهەنەمی هەیە الله تعالی ئەوەی بەقسەی نەكا ئەیخاتە جەهەنەم وە ئەوەشی بەقسەی بكا یەیخاتە بەهەشتەكەیەوە ، ئەبێت یەقینت وابێ .

الله تعالی لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ : (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا)[9]

(إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ)بەراستی ئیمانداران ئەوانەن ! (الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ)كە یەقینیان وایە و ئیمانیان وایە بە الله و بەپێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم)( ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا)دواتر هیچ گومانێك لەدلیاندا دروست نابێ .

---

[8] :سورة محمد اية :١٩
[9] :سورة الحجرات اية : ١٥

گومان نابێ لەدلت دا دروست ببێ ئەگەر گومان  هەبوو لەدلتدا و شكت هەبوو لەم دینە ئەوە تۆ نەچویتۆتە ناو دینەكە . بەلكو ئەبێت بلێ و لەدلیشت وابێ چۆن ئەزانی بۆنمونە ئەوەی پێشت مێزێكە یاخود ئەمە ئینسانە ئەبێت بەم شێوەیە بلێت و لەدلتدا وابێت كە ئەم دینە حەقە وە بەهەشت و جەهەنەم حەقە .

دواتر ئەلێ (وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ)[١٠] ئەو كەسەی كە هیچ گومانێك بەرامبەر بەم دینە لەدلیدا دروست نابێ كە حەق و راستیە تێ دەكۆشێت بەمالی و بەنەفسی لەپێناوی الله دا وە الله تعالی ئەفەرمووێ ئەوە راست دەكات بەراستی . بەو مانایەی ئەوەی وانەكات درۆ دەكات .

## سێ یەم مەرج بریتیە الإخلاص:

ئەوەیە كە دەبێت تۆ هەمووشتێكت لەپێناوی خوای گەورە بێ نابێت لەپێناوی ئینسانەكان بێ كە پێ دەوترێ ئیخلاص (الإخلاص مناڧ للشرك) تۆ نابێت شەریك بریار بدەی بەلكو دەبێت یەكخوا پەرست بی ئەبێ پوختەی عەمەلت بەس بۆ الله بكەی ، ماناكەی ئەوەیە كە هەموو كار و كردەوەكەی خۆت پوختەی بكەیتەوە بەس بۆ الله كە (وحده لاشرك له)هیچی صەرف نەكەی بۆغەیری خوا  نوێژ بۆ خوا رۆژوو بۆخوا زەكات بۆخوا و حەج بۆ خوا دوعا و پارانەوە نەزر كردن وە صەداقات كردن هەمووی بۆخوای تعالی شتێك سەرف بكەیت بۆغەیری خوا تۆ موشریكیت  واتا تۆ خوات پەرستوە و غەیری خواشت پەرستووە خوای گەورە لێت قبول ناكا بەم شێوەیە .

الله تعالی دەفەرمووێ (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ)[١١] هەمووان ئەمریان پێ نەكراوە إلا بەوە نەبێت كە ئەبێت پوختەی كارەكەت بكەیتەوە بۆ خوای تعالی ، نابێت بۆ كەسیترى بكەیت . خوای تعالی دەفەرموییێ ئەوەت لێ داواكراوە ئەبێت

---

[١٠]:سورة الحجرات اية : ١٥
[١١] سورة البينة اية : ٥

تەنها الله بپەرستی بەپوختەکردنی کارەکانت بۆ ئەو (لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ)ئەبێت شەریك پەیا نەکەی .

وە هەموو عەمەل و کردەوەیەکی تۆ ئەبێت لەسەر ئەم عەقیدەیە بێت ئاگاداربە وە شەو رۆژ تۆ ئەمە ببیستە لێ بێتاقەت مەبە  چونکە ئەگەر ئەمەت نەبێ هەموو کارو کردەوەت بەفیرۆ دەچێ وە هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون وە شتەکە زۆر گەورەیە .

زانایان دەفەرموون : ئەگەر بێنە سەرباس و لێکۆلینەوە دەفەرموون : یەکەم شت ئەوەیە کە لەسەر ئێمە بیزانین . واجبترین واجب ئەوەیە کە تۆ بیزانیت ئەوەیە کە بزانیت بۆ دروست بوویت . پرسیار دەکەین بۆ دروست بووین ؟ الله تعالى دەفەرموی بۆ عیبادەت واتابۆ خۆزەلیل کردن بۆ خوا بەس بۆ ئەوە دروست بووین بۆ هیچیتر دروست نەبووین وە جێگەت لەسەر ئەم زەمینە چیە وە بۆتۆ لەدایك و باوك بووی بۆ ئادەم هاتە خوارەوە وە بۆ ئادەم لە ئەصلدا دروست کرا ؟ وە بۆ پێغەمبەر محمد دروستکراوە (صلى الله عليه وسلم)وە بۆ قورئان نێردراوە بۆ خوا مەلائیکەی دروست کردوە ؟ هەمووی بۆ عیبادەتی خوا و هیچتر نیە ، یانی غایەی ئێمە لەم بونەوەرەدا و مال و سەروەت و سامان و نەفسمان نیە بەلکو غایەی ئێمە عیبادەت کردنی خوای تعالى یە ،

کەواتە ئەبێت تۆ شەو و رۆژ لەعیبادەتی خوای گەورەدا بیت وەعیبادەتیشت لێ وەرناگیری بەم مەرجانە نەبێت کە باسی دەکەین .

ئیوە سەیری مەلائیکە بکەن خوای تعالى مەلائیکەی دروست کردوە ، مەلائیکەکانی خوای گەورە نێر و مێیان نیە کچ و کوریان نیە وەکو ئێمە هاوسەر گیری ناکەن پێویستیان پێ نیە وە ئەصلن ئەم مادەیەیان هەر نیە وە یەکێکیتر لەمواصەفاتیان خواردن و خواردنەوەیەیان نیە خوای تعالى  وای دروست کردوون ناخۆن و ناخۆنەوە بەندەیەکن لەبەندەکانی خوا بەبێ ئەوەی پێویستیان بەخواردن و خواردنەوە هەبێ .

ئەی بۆچی دروستی کردوون ؟ یەکەمین خال ئەبێ بزانین خوای تعالی باسیان ئەکات لەقورئاندا ئەفەرمووی : (يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ)[١٢] شەو و رۆژ خەریکی تەسبیحاتی خوان و هیچ کاتێك وەرەس و بێزار نابن . تۆ سەیرکە کە ئیسرافیلی کە دروست کردوە کاری ئەم مەلائیکەتە ئەوەیە لەوەتەی دروستی کردوە تارۆژی قیامەت دێت سەیری الله تعالی دەکا تاوەکو ئەمری بۆبێت تاوەکو فوو بە نەفخی سوردا بکا راوەستاوە لەبەردەمی الله تعالی دا لە سەرەتای دونیاوە تاوەکو کۆتایی دونیا وا راوەستاوە و چاوەری ئەمری الله تعالی دەکا ئیشی بەس ئەمەیە وە بێتاقەتیش نابێ نە ئاو دەخوا و نەنان دەخوا نە ژنی هەیە و نەمندال هیچ بەس الله تعالی بۆ ئەمەی دروست کردوە .

بۆیە مەلائیکەکان پێیان سەیر بوو کە الله تعالی وتی من ئنیسانێك دروست دەکەم خوێن دەرێن و گوناهە دەکەن وتیان ئەی ئێمە بۆ ناخیتە سەری ئێمە شەو و رۆژ سبحان الله تۆ ئەکەین خوایە ئێمە هیچ شتێك ناکەین لە عیبادەتی تۆ زیاتر . الله تعالی ش فەرمووی من حیکمەتی خۆم هەیە لەم کارەدا ئێوە نایزانن وە ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن ،ئێمەی دروست کرد لەسەر ئەم زوییەی داناین ئێمەش ئەوتا کەخۆمان ئەبینینەوە زۆربەمان بەلای شەیطانەوەین وە پێشی وتووین ، الله تعالی دەفەرمووی : شەیطان دووژمنتانە وە بیکەن بە دووژمنتان ئەیەوێ حیزبەکەی بەرە و جەهەنەم بەرێ .ئەوەتا زۆربەی زۆری شوێنی دەکەون پێمان دەلێن باوکتانی دەرنەکرد لەبەهەشت هەر یەك کەلیمە و وەسوەسەیەك نەبوو ! خۆ شەیطان خۆی نەچوە ناو بەهەشتەوە بە رێگەی وەس وەسە چۆن دێتە دلی ئێمەوە ئەلێ ئەوها بکە ئەوەها بوو پێت ئەلێ بکە تۆش بەقسەی دەکەی ، خۆ شەیطان وەکو پیاوێك نایەتە بەردەمان و بلێت شەیطان ببینم دەیکوژم نەخێر بەلکو ئەوەیە کە لەدلتدا یە پێت ئەلێ بکە خراپەکە مەبەستمانە شیرك بکە و کوفر بکە و معصیەت و بیدعە بکە گوناه بکە و زینا بکە و ئارەق بخۆ هەرچی خراپە پێت دەلێ بکە وە لەلات شیرینی دەکا و تۆش ئەچیت بەقسەی ئەکەیت ئەوەش عیبادەتی شەیطانە.

---

[١٢] :سورة الأنبياء اية : ٢٠

الله تعالى دەفەرمووی : (أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ)[13] پێم نەوتن ئەی نەوەی ئادەم شەیطان نەپەرستن دووژمنی ئێوەیە ! (وَأَنِ اعْبُدُونِي ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ)[14]بەقسەی من بکە ئەمە رێگە راستەکەیە .

ئەمرۆ ئینسانەکان لە شوێن کەوتەی شەیطاندایە زۆربەی زۆری ئێوە بەس سەیری سەر زەوی بکەن چەن کەسی تێدایە ئەلێن ٧ ملیار و نیوی تێدایە ئەلێن ملیار و نیوێك موسلمانە ئەویش بەناو ! بەحەقیقەت نا ٦ ملیاری کافرە ئەم سەر زەوییە .واتا ئەم سەرزەوییە بەزۆری لەگەل شەیطاندایە لەگەل رەحماندا نیە .

الله تعالى دەفەرمووی : زۆربەی زۆری خەلکی فاسقە (وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ)[15] وە دەفەرمووی الله تعالى : (وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ)[16] زۆر بەی زۆری بړواداران بە الله موشریکن ،! چونکە بړوای بە الله هەیە بەس عیبادەت بۆ یەکێکتریش دەکا لەگەل الله دا الله تعالى دەفەرمووی : من ئەپەرستی و نوێژم بۆ ئەکا و رۆژووم بۆ ئەگری و حەجیشم بۆ ئەکا وە صەدەقاتیش ئەکا بەلأم شەیطان و ئینسان و جنۆکە و دارو بەرد و ریساو یاسا دەپەرستی لەگەلدا وە پەرستنەکەی بریتیە لە بەقسەکردنەکەی

تۆ کاتێك بە رۆژوو دەبی ئەمە عیبادەتە وە بەقسەی خوای گەروە دەکەی ئەم عیبادەتە تێك مەدە هەلی مەوەشێنەوە کەکاتێك دەچیتە سەر گۆرێك و دەلێ یا عبدالقادر و یا رسول الله هاوار (صلى الله عليه وسلم) یاخود پەیرەویی لە بەرنامەیەکیتر بکەی لەغەیری بەرنامەی الله تعالى ، چونکە عیبادەتەکان هەمووی تاقیکردنەوەیە بۆتۆ کە تۆ عیبادەت دەکەی واتا بەقسەی خوا دەکەی بەقسەی کەسێکیترت کرد تۆ عیبادەت بۆی کرد گەرقسەکەی پێچەوانەی الله و پێغەمبەرەکەی بوو (صلى الله عليه وسلم). گەر وات کرد و بەقسەی ئەوانەت کرد کە قسەکانیان پێچەوانەی شەریعەتی الله تۆ عیبادەتەکەت هەلوەشاندوە و ئەمە شیرکەکەیە هەرچەند نوێژ و رۆژوو بگری هیچ سودێکی نیە ئەوکاتە هەموو کارەکەت بە بێ هودە رۆیشت .

[13] :سورة يس اية :٦٠
[14] :سورة يس اية :٦١
[15] سورة ال عمران اية :١١١
[16] :سورة يوسف اية :١٠٦

الله تعالى دەفەرمووی : (وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا)[١٧] هەرعەمەلێك تۆ بیكەیت من دەیكەم بە با و تۆزی با دراو مادەم شەریكت بۆ الله پەیاكرد. ئەوەیە شەریك پەیا كردن ، شەریك پەیاكردن لەعیبادات وە شەریك پەیا كردنیش لە حوكمرانی ئەبێت تۆ بەس بەحوكمرانی الله رازی بیت ئەگەر بێتوو بە حوكمرانی غەیری الله رازی بیت تەئیدی بكەی تۆ موشریكی بەو مانایەی لەگەل الله دا تۆ حوكمرانیەكت دانا الله حوكمرانی بكا وە ئەو ئینسانەش حوكمرانی خۆی بكا ! بەكەیفی خۆی لەبەر ئەوە الله تعالى دەفەرمووی : (وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا)[١٨] الله تعالى بەهیچ شێوەیەك رازی نابێ لە حوكمی ئەودا تۆ شەریك پەیدا بكەی لەریوایەتێكی ریوایەتەكاندا دەفەرموی (ولا تشرك)تۆشەریك پەیدا مەكە لەحوكمرانی الله تعالى دا .

الله تعالى وتی تۆ دەبێت دەستی دز ببری ئەبێ دەستی ببری وتت سجنی ئەكەم تۆ موشریكی چونكە تۆ قسەی الله ت فرێدا و قسەی خۆت جێ بەجێ كرد هەزارجار بەخۆت بلێت من موسلمانم قبول نیە لەلای الله تعالى ، الله تعالى دەفەرمووی ئەبێت عەرق خۆر داد كاری بكرێی ئەوێش ئەلێ نەخێر عافیەتی بێ ئازادییە ! تۆ موشریكی بەم قسەیەت چونكە تۆ حوكمی الله ت فرێیدا و حوكمی خۆتت زال كرد بەسەر حوكمی الله دا .

ئێستا ئێوە سەیر بكەن الله تعالى ئاسمان شەرق بكا بە ئێمە بلێت تۆحوكمرانی وە تۆ حوكمرانی وە تۆش حوكمرانی !ئادەی مام حاجی وەرە الله تعالى پێت ئەلێ ئادەی بەندەكەم وەرە ئەو كەسەی كە زینای كرد ئەگەر كچ بوو ١٠٠ داری لێ بدە ئەگەر ژن بوو بەردەبارانی بكە ،چۆن وا دەكەم والله واناكەم !من دەچم سجنی ئەكەم ، ئەوێش ئەلێ كێشە نیە ! نەخێر بەلكو شەیطان معارەزەی كرد وتی سەجدە بەرە وتی سەجدە نابەم وتی تۆ كافری برۆ دەرەوە چەندان عیبادەتی هەبوو ئەو ئیبلیسە !لەبەهەشتدا بوو وتی بكە وتی ناكەم تۆ كافری (أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ)[١٩]بزانە كافر چیە زۆر گرینگە ئەم خالە .

---

[١٧] :سورة الفرقان اية :٢٣
[١٨] :سورة الكهف اية : ٢٦
[١٩] :سورة البقرة اية : ٣٤

کافر هەر ئەوە نیە جوێن بە الله و پێغەمبەرەکەی بدا (صلى الله عليه وسلم) نوقتە و خالی کافربوون زانایانی ئیسلام  لەناو کیتابە فقهیەکاندا لە (باب الرد)نزیکەی ٤٠٠ خال زیاتر باس دەکەن هەر بەو کەلیمەی و بە باوەرە و بەو کارە تۆ کافر دەبی ئەبێ وریا و وشیار بیت و بترسی لەم کەلیمەیە ، الله تعالى بەمەرج دینت لێ وەردەگرێ کەواتە نابێ لەعیبادەتدا تۆ شەریکی بۆ پەیا بکەی نابێ لەحوکمرانیدا تۆ شەریکی بۆ پەیا بکەی نابێ قسەی هیچ کەسێك بخینە سەر قسەی الله نابێ خۆمان بکەین بە پیاوی ئینسانەکان وە نابێت خۆمان بفرۆشین بە ئینسانەکان بەلکو ئەبێت خۆمان بفرۆشین بە الله .

هەر خۆتان سەیر بکەن بەیەکێك بوترێ خۆفرۆشی چەند ناشرینە ئەم کەلیمەیە خۆت بەکێ فرۆشت ؟ ئەگەر بە الله ئەوە زۆر جوانە بەس بە غەیری الله شیرك و کوفرە و ناشرینە  نابێت خۆت بفرۆشی إلا بە الله نەبێت .

## مەرجی چوارەم بریتیە لە الصدق:

الله تعالى دەفەرمووی : (الم (١) أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ)[٢٠] خەلکی وا دائەنێ کە بلێ من ئیماندارم الله تاقی نەکاتەوە الله تعالى توشی فیتنەی[٢١] نەکا ؛ (وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ)[٢٢] ئێمە پێشووەکانمان تاقیکردەوە ، الله تعالى دەیەوێت ئیظهاری بکا لەعالەمەی وجود دا وە لەو خۆی ئەیزانی لە رابردوودا بزانی کێتان راستگۆن وە کێتان درۆزنن .

ئەم خالە باسی صیدق ئەکا ئەبێت راست بکەیت لەگەل (لا اله الا الله)کەت و درۆ نەکەیت مونافیق نەبیت لەناوەوە رقت لە  الله و پێغەمبەری الله بێت (صلى الله عليه وسلم)لەدەریشەوە بێت لەگەل موسلماناندا دابنیشیت و بلێت من موسلمانم ئەبێت لەناوەوو و لەدەرەوە راست بکەیت .

---

[٢٠] :سورة العنكبوت اية : ١-٢

[٢١] : فیتنە لێرەندا بەمانای تاقیکردنەوە دێت

[٢٢] :سورة العنكبوت اية : ٣

## مەرجی پێنجەم بریتیە لە المحبە:

ئەبێت خۆشت بویێ ئەبێت ئەم وشەیەت وهەرچی لەناو ئەم وشەیەدایە کە (لا الە الا اللە)یە خۆشت بویێ وە اللە و پێغەمبەرت (صلی اللە علیە وسلم) ت خۆش بویێ وە هەرکەسێکیش لە شوێن کەوتوانی دینی ئیسلام بوو لەهەرشوێنێك بوو لە ئەرز بوو یاخود لە ئاسمان ئەبێت خۆشت بویێ وە هەرچی پەیوەندی بە اللە وەوە بوو ئەبێت خۆشت بویێ خۆشت نەوێت تۆ کافری .رقت لەموسلمانێك بێت کافری لەبەر ئیسلامیەتەکەی ئاگاداربە نەك لەبەر ئەخلاقێکی ناشرینی . من موسلمانێك رقم لێ یەتی لەبەر ئەوەی درۆ دەکا بەلێ لەبەر ئەم درۆیە رقم لێتە بەس بە گشتی نا لەبەر ئەوەی تۆ ئیمانداری خۆشم ئەوێت و ئیمانەکەتم خۆش دەوێ بەلاَم ئەو خالە و ئەم خالە رقم لێ یەتی چونکە ئەم خالە و خالە پابەند نەبووی بەدینی اللە تعالی وە.

سەیر بکەن یەهود ئەلێن وەکو لە حەدیسیش هاتووە رقیان لە جوبریل بوو اللە تعالی فەرمووی : هەرکەسێك رقی لەجوبریل بێت کافرە (فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ)[٢٣]بلێت من اللە م خۆش دەوێ و پێغەمبەرم خۆش دەوێ (صلی اللە علیە وسلم) نوێژی بۆ ئەکەم و عیبادەتی بۆ ئەکەم وە خوێنی خۆشمی لەسەر ئەرێژم بەس رقم لە جوبرایلە اللە تعالی دەفەرموێ : تۆ کافری بۆجەهەنەم هیچ کاتێك نایتە دەروەوە.

ئەم خۆشەویستیە اللە تعالی لەقورئاندا باسی کردوە ئەفەرمووی : (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا)لەناو خەلکدا کەسانێك هەن لەغەیری اللە شەریك بریار ئەدەن هاو شێوە و هاوێنەی اللە (يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ)سەیرکە اللە تعالی ئەو کەسەی بەقەد اللە تعالی خۆشت بویێ یەکسەر بەتۆی وت تۆ موشریکی وتی تۆ ئەو کەست خستە ریزی اللە ئیتر دایك بێ یاخود باوك بێ سەرکردە بێ دار بێ و بەرد بێ و سنور بێ هەرچی شتێك بێ هەتا بلێ پێغەمبەرم لە اللە خۆشتر دەوێ یاخود بەقەد اللە خۆشم دەوێ (صلی اللە علیە وسلم)تۆ کافری . نابێت وابی بەلکو ئەصلی هەمووشتەکان اللە تعالی یە من لەبەر خاتری اللە تعالی پێغەمبەرم خۆش دەوێ (صلی اللە علیە وسلم)نەك لەبەر خاتری

---

[٢٣]:سورة ال عمران اية : ٣٢

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) الله م خۆش بوێی ! ئەبێت ئاگاداربن پێغەمبەر مخلوقە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ئینسانە خالق و ئیلاهـ نیە خوا و نیە و ئەرز و ئاسمانی دروست نەکردییە .ئەگەر الله تعالی نەیکردبا بە پێغەمبەر ئێمە ئەمان ناسی ؟! نەخێر نەمان ئەناسی ئینسانێك بوو تەواو . بەلام الله تعالی ئەوی کرد بە پێغەمبەر بە ئێمەی وت ئەبێت خۆشمان بوێی ئەگەر خۆشت نەوێی کافر دەبی ، بەلام سەیرکە زۆر کەس هەیە ئەلێ الله و پێغەمبەر ئەزانێ ! نابێت وابلێت نابێ پێغەمبەر بخەیتە تەنیشتی الله وە لەزانیندا چونکە پێغەمبەر نازانی ئێستا پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) نەماوە تاوەکو بزانی و وەحی بۆ بێت . شتێك روو ئەدا لەنێوان تۆ و هاورێکەت ئەلێ الله و پێغەمبەر ئەزانی ئەمە لەکاتی صەحابە وتراوە کە پرسیارێکیان لێکراوە ، وتویەتی ئەم شتە ئەزانن ئەوانیش وتویانە (الله ورسول أعلم)ئەمە لەکاتێکدا کە پێغەمبەر لەژیاندا بووە (صلی الله علیه وسلم) بەس ئێستا لەنێوان من و تۆدا شتێك روودەدا بلێم الله و پێغەمبەر ئەزانی! ئەوە پێغەمبەرت کرد بە شەریکی الله لە زانینی غەیبدا ، بەلکو غەیب تەنها الله دەیزانی الله تعالی دەفەرمووی : (قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ)[24]تەنها الله غەیب ئەزانی .کەواتە ئەبێ ئاگاداربین الله لەسەرووی هەموویەوەیە نابێ بلێ الله و پێغەمبەر . بلێت الله و پێغەمبەر و صەحابە ئاگای لێت بێت ! یاخود بلێ داوادەکەم لە الله و پێغەمبەر و لەصەحابە کە رەحمان پێ بکا ئەبێت بلێ تەنها الله . ئەگەر کەسیکیترت هێنا لەگەلی ئەوە تۆ شیرکت کرد و تۆ موشریکی ئەکاتە یەکسەر الله تعالی هەموو کردەوەکەت بە بادەدا .

(وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ)ئەوانەی ئیماندارن الله تعالی یان لەهەمووشتێك زیاتر خۆشتر دەوێی. من پرسیار دەکەم ئێستا وایە ؟ الله تعالی پێت ئەلێ بەقسەم بکە بەقسەی ناکەی سەرکردەیەك پێت ئەلێ بەقسەم بکە رائەکەی و ملی خۆت ئەشکێنی لە الله زیاترت خۆشتر دەوێی، الله تعالی پێ دەلێ لەپێناومدا بجەنگە ناجەنگێ ئەلێ کاکە ئەوە بەکەلك نایەت سەکردەیەك پێت ئەلێ بجەنگە ئەچیت سەرکردەکانی دونیا هەمووی وانەبوون ، هەمووتان حربی عیراق و ئیرانتان لە بیر نیە ٨سال ئەو خەلکە لەترس و لەرەرزدا

[24]سورة النمل اية : ٦٥

پۆستالی لەبەردا ئەکرد بەقسەی صەدام و خومەینی یان ئەکرد بۆ کوێی چوون ئێستا ئەوانە نەتیجەکەیان هەر مال وێرانی بوو ، دەی الله تعالی پێت ئەلێ لەپێناوی من دا بجەنگە و لەپێناوی مندا شەربکە ئەبینی مەگەر کەمێکی زۆر کەم نەبێ کەئەویش تەنها الله تعالی خۆی ئەزانی [25] نەخێر بۆ الله نابێ بۆ الله خراپە و بقەیە بەس هەر سەکردەیەك ئەمریکا ئێستا بلێ من هێزێك دروست دەکەم وەرە مانگی ئەوەندە دۆلارەت ئەدەینێ بزانە ملی خۆت ئەشکێنی یاخود نا کەچی الله تعالی ئەلێ وەرە لەپێناوی مندا بجەنگە من بەهەشتی هەتا هەتاییت ئەدەمی ئەلێ نەخێر ئەمە بقەیە و بەکەلك نایی ئەمە ئێ قورئان هەموی باسی ئەوە ئەکا . ئایا خۆشەویستی الله لەسەرووی خۆشەویستی ئەورووپا و ئەمریکاوە بوو ! نەخێر .پێ ئەلێ کاکە تۆ لەو منزەمەیە ئیش دەکەی ئەوە هەوالگیرییە لەسەر موسلمانان ئەلێ من پەیوەندیم چیە موهیم من پارەکەم بەدەست بێنم برۆ سیخوری بکە لەسەر موسلمانان با پارەکەت بەدەست بهێنی ئەی قورت بەسەر بێ .هەموشتێك هەر پارەیە !

کەواتە ئەبێت الله ت لەهەمووکەسێك و شتێك زیاتر خۆشتر بوێی وە ئەبێت شەیطان و ئەولیای شەیطانت رق لێ بێت ئەگەر بێتوو خۆشەویستیت هەبێ بەرامبەر بە شەیطان ئەولیایی شەیطان تۆ کافری ، کەچی ئەمرۆ شەیطان پەرستان لەسەرووی ئێمەوە حیساب ئەکرێن رێز و حورمەتی ئەوان لەسەرووی رێز و حورمەتی ئێمە حیساب ئەکرێ .

من تێناگەم تۆ بەس بیربکەرەوە شەیطان پیسە یاخود پاکە ؟! ئادەی موسلمانان بۆ وامان لێهاتووە ئەبێ رێز لە شەیطان پەرستێك بگرین ئەو زەلیلیە چیە ئێمە تووشمان بووە تۆ ئەلێ (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)مامۆستای ئاینی هەیە الله تعالی لەناوی بەریی ئەلێ تۆ لەبەردەمی شەیطان پەرستێکدا هەستی بریندار مەکە و مەلێ (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)هەی نەگەبەت الله تعالی دەفەرمووێ : (فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ ۚ)[26] تۆش ئەلێت لەبەر دەم شەیطان پەرستەکە مەلێ (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)تخوا

[25] : مەبەستی گشتی نیە

[26] :سورة فصلت اية : ٣٦

ئەمە سەر لێشاوی نیە . والله مامۆستای بەناو ئاینی هەبووە قورئانی خوێندۆتەوە لەمەجلیسدا وتویەتی (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)ناخوێنین بۆئەوەی برا شەیطان پەرستەکانمان خەفەت نەخۆن ! ئێ کوفر لەوە زیاتر چیە بەس پێم بڵێ !.

الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ)[٢٧] شەیطان دووژمنتانە وە هەرئەوەندەش نیە کە بزانی دووژمنتانە بەلکو بیشیکە بە دووژمن چونکە ئەیەوێت حیزبەکەی بەرەو جەهەنەم بەرێت . واتا ئێمە ئەبێت رێز لە حیزبی جەهەنەمیەکان بگرین ! ئەم زەلیلییە چیە رووی کردۆتە ئەم میلەتە ئەی هاوار مەلای ئاینی دائەنرێی و نەصرانی دائەنرێی شەیطان پەرست دائەنرێی ئەبێ رێز لەهەمووان بگریی والله کافر ئەبێ ئەو کەسەی ئەوها بکا ئەوە نەصی قورئان و قسەی الله تعالی یە ئاگاداربن .

## مەرجی شەشەم بریتیە لە الانقیاد:

(الانقباد منادی الترك)ئینقیاد واتا بەقسە کردن جلەو دانە دەست بەقسەی بکەیت و سەمع و تاعەی بکەیت منقاد بیت چۆنت را ئەکێشی بلێت باشە ، تەشبیه نەبێت حەیوانێك کاتێك کە حوشترێك تۆ پەتێکی ئەخیتە ملی و رای ئەکێشی بەدوایی خۆتدا دێت یاخود نا ؟!  چۆن ئەو لەگەلت دێت ئەبێت تۆش ئەوها بلا تشبیه لەگەل فەرمانەکانی الله تعالی دا ئەوها بێت نابێ ئەو سەر و ئەو سەر بکەیت ،ئەگەر وتی وەرە وتت نایەم تەواو حیسابت رۆیی نابێت بلێت نایەم بەلکو دەبێت بلێت بەسەرچاو نابێت تەرکی بکەیت (أن تعبدوا الله وحده والاتنقاد للشرعة وتؤمن بها وتحتقید أنها الحق )کاکە خۆت یەکلابکەرەوە موسلمانی بەقسەی بکە موسلمان نیت تەواو و بلێ من موسلمان نیم .

تەسلیم ئەبی ئەلێت بەلێ دە بەقسەی الله تعالی بکە ، هەر ئەوەندەت لەسەرە بلێ ئەوشتەم نەزانی فێرم بکە نەك معارەزەیی بکەی ،. معارەزە مەکە .

[٢٧] :سورة فاطر اية : ٦

الله تعالی دەفەرمووی : (وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ)[28] بگەڕێنەوە بۆ لای الله تعالی و تەسلیمی بن ، ئەوە الله تعالی پێمان دەلێت لەقورئانەکەی پێمان ئەلێن : وەرن تەسلیمم بن با تەسلیمی بین بزانین چی دەلێ ، وەرە قورئان بخوێنەوە وەرە حەدیسی پێغەمبەرەکەی بخوێنەوە (صلی الله علیه وسلم)بزانە چی ئەلێت .

## مەرجی حەوتەم بریتیە لە القبول :

ئەبێت قبولی بکەیت هەرچی وتوە خەلك وا لێ دەکەم و بەهەشتم وا دروست کردوە و جەهەنەم وا دروست کردوە ئەو هەوالەت ئەدەمی واو وا ئەبێت بلێت هەمووی راستە و قبولم کرد پێغەمبەر چی پێوتی (صلی الله علیه وسلم)حەدیسی صەحیح کەهات بلێ قبولە رەدی نەکەیتەوە .

سەیری موشریکینی مەککە بکەن الله یان ئەپەرست و لەگەل الله دا خەلکیتریان ئەپەرست چەند شتێکی بۆدانان و الله تعالی تاقیکردنەوە یەك لەوشتانە بریتی بوو لە دارەکەی ناو جەهەنەم هەمووتان شجەرەی زقومتان نەبیستووە ئەو دارەی کە لەناو جەهەنەم الله تعالی دورستی دەکا ئەوە بۆچی باسی دەکا بۆ تاقیکردنەوەیە ،ئەلێ کافرەکان دەستیان کرد بە پێکەنین و گالتە جاری بەپێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)وتیان تخوا تۆئەلێت جەهەنەم وا گەرمە و ئاخر دار لە جەهەنەم ئەروێ ! ئەی بێ عەقل ئەگەر الله وتی (کن فیکون)چۆن ناروێ ئەری والله دەروێ ئیبراهیم (علیه السلام)ئەبوایە بسوتایە لەناو ئاگرەکە بەس نەسووتا ، خوایە و جل وعلایە دەسەلاتی ئەم سەرو ئەو سەرو بێ مونتەهایی هەیە ، وتیان تخوا شتی وا دەبێ ئێستا بۆمان دەرکەوت کە محمد شێتە !دەلێت والله دارێك لە جەهەنەمدا هەیە ! دەستیان کرد بە پێ کەنین ! الله تعالی دەفەرمووی : (إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ (٤٣) طَعَامُ الْأَثِيمِ (٤٤) كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ (٤٥) كَغَلْيِ الْحَمِيمِ)[29] الله تعالی پەنامان بدا و ئەبێ ئێمەی موسلمان بگرین ، ئەلێ داری

[28] سورة الزمر اية : ٥٤
[29] :سورة الدخان اية : ٤٣-٤٤-٤٥

زەقووم دارێکی ئەوەندە تفت و تال و کولبەکولە کە لەگەل کەسکە لەتاودا ئەیخوا هیچی لەبەردەستدا نیە ، بەبەردەوام تۆ لەجەهەنەمدای چیت لەبەردەستدا یە تۆ بیخۆیی ئاوی سارد ! نەخێر بەلکو ئاوی گەرمی کول بەکول خواردنی خۆش ! نەخێر بەلکو زەقووم ئەلێ کە ئەیخوات لەقورگی ناچێتە خوارەوە ئەلێ لەناو سکیدا ئەکولێ سکی هەمووی دەهێنێتە کول الله تعالی ئەمر دەکا وابێت ئیتر تەواو ، قوریشە کافرەکان دەستیان کرد بە پێ کەنین وتیان چۆن ئەبێ دار هەبێ لەناو جەهەنەم ئەوەش عەقلی ئینسانە .

یاخود پێغەمبەری الله (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی : من چووم بۆإسرا و میعراج دەستیان کرد بە پێ کەنین وتویان ئەبو بکر وەرە ئەوە هاورێی شێتەکەت ئەلێ هەر ئەم شەو من لەمەککە وە فریم چوم بۆ بیت المقدیس کورە کاکە ئێمە لێرەوە بۆ بیت المقدیس بەمانگ ئەرۆین و بەمانگیك دێنەوە ئێستا ئەو دەلێ بە لەحزات چووم و هاتمەوە چومە ئاسمانیش و هاتمەوە .باشە من بە ئێوە دەلێم ئەوە لەعەقلی ئێمەدایە یاخود ئەبێت تەسلیم بە الله بین ! ئادەی وەکو عەقلی ئینسان لەعەقلی کێدایە هەروکو کافرەکان عەقلیان نەیبری ئەوشتە بەس ئێمەی موسلمان نەخێربەلکو ئیمانی پێ دەهێنین و بەبێ دوودلی و بەراستی ئەزانین . تۆ الله بەراست دەگیرێی تۆ سەیری بەهەشت بکە تۆ ئیمانت بە بەهەشتێك هەیە ئەلێ بەهەشت هەتا هەتایی یە ئاوەکەی بۆگەن نابێ دارەکەی کرمی نابێ میوەکەی نارزێی ئینسانەکەی پیر نابێ نامریی و نەخۆش ناکەویی هیچ کەسێك پێ نالێ مەکە و وامەلێ وە هەتا هەتاییە ئەژێی ئەمە لەعەقلی ئێمەدایە !؟ ئەمە الله تعالی دایناوە جل وعلا تۆ بروات بەمە هەیە .

تۆ بروات بەوە هەیە کە خوایەك هەیە و نەت بینیوە عیبادەت بۆ خوایەك ئەکەیت کە نەت بینیوە قورئان لەنێوانماندا هەیە ،. کەواتە ئەم ئیمانە بۆ لەدەست ئەدەیت و شوێن ئینسانێکی هیچ و پوچ بکەویت پێچەوانەی الله تعالی بکا با هەر کەسێك بێ خۆت بکە بە بەندەی خوا خۆت مەکە بەبەندەی کەس گەرنا تۆ موشریکی بەلکو بەندایەتی تەنها بۆ الله بکە کەواتە تۆ قبولی ئەم ئایەت و حەدیسانە بکە ، ئێستا مەلائیکە ئەگەر باس بکەیت

لەعەقلی ئێمەدایە دێی و دەروا وناخواو ناخەوێی ئەمە لەعەقلی ئێمەدایە نەخێر بەس ئەبێت قبولی بکەیت و بەراستی دابنێ .

ئێستاش کەسانێکی زۆر هەیە بەتایبەتی دکتۆرەکان بروایان بەجنۆکە نیە ئەلێ کاکە ئەو کابرایە تووشی سەرع بووە جنۆکە دەستی لێ وەشاندوە بەنەصی قورئان و حەدیس هەمانە ئەلێ من بروام بەم شتە نیە هەشە دەلێ من هەر بروام بە جنۆکە نیە قورئان دەفەرمووێی سورەتێك هەر ناوی (الجن)ە الله تعالی دەفەرمووی (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[30] ئەلێ من بروام بەجنۆکە نیە ! ئێ تۆ کافری و تەواو خۆت بەموسلمان ئەزانی ئەوە کافرە و ئەبێ سەری پانبکرێتەوە ئەگەر دەسەلاتی ئیسلام هەبێ کەچی ئەوە دکتۆریشە لای خۆیی ! .

کەواتە قبولی بکەن و ئەوەی لەقورئاندا هاتووە بلێ قبولە حەدەم چیە قبولی ناکەم یەك کەلیمەی تۆ قبول نەکەی تۆ کافری رەخنەیەکی لێ بگریت تۆ کافری  با نوێژیش بکەیت و با بەرۆژووش بی با خۆت لەعابیدترین کەس بدۆزیتەوە نەخێر چونکە تۆ رەدی شتێکت کردۆتەوە کە الله تعالی وتویەتی وایە تۆش وتوتە وانیە ! .

الله تعالی فەرموویەتی : (إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ * وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَجْنُونٍ)[31] ئەگەر پێیان بوترایە بەو خەلکە کە پێغەمبەران دەهات دەیانوت بلێن (لا اله الا الله)( يَسْتَكْبِرُونَ)ئەیان وت نەخێر شتی وا نیە ئێمە تەنها بەقسەی خوا ناکەین بەقسەی خەلکیتریش دەکەین وە شوێن شتیتریش دەکەوین (وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَجْنُونٍ)ئایا ئێمە خواکانی خۆمان بەجێ بهێلین بۆ شاعیرێکی شێت کە محمدە !

تخوا من یەك پرسیارتان لێ دەکەم ئەو قسانەی من دەیکەم لەناو واقیعیشدا وانیە هەمووی بەمن نالێت شێت ! ئەلێن بەخوا ئەم کابرایە زۆر شێتە ئەوە دونیا و ئەمریکا و

[30] سورة الذاريات اية : ٥٦
[31] سورة الصافات اية : ٣٥-٣٦

ئەوروپا ئەوە تەكەنلۆجیا ئەویش باسی چیم بۆ دەكا ! زۆر بەی خەلك وامان پێ دەلێ بەئێمە دەلێت شێت ئەلێن ئەو ریشە چیە ئەوە شێتە .

## مەرجی هەشتەم بریتیە لە الكفر بما یعبدوا من دون الله:

ئەبێ لەغەیری خوا نەپەرستی نەك هەر ئەمەش بەلكو دەبێت كافر بیت پێیان ، الله تعالى دەفەرمووی : (فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ )[٣٢] عروەتی وثقی (لا اله الا الله) یە كەی تۆ دەستت گرتووە بە (لا اله الا الله)وە؟

ئەو كاتە كە بلێت من بروام بە هیچ پەرستراو هیچ رێنمایی لێكراوێك و شوێنكەوتوانێك كەوا خەلك شوێنی كەوتوە نیە تەنها الله نەبێت ، نە حیزب و نەدار و بەبەرد و نەعەمەلەم نە زیندوو وە نەمردوو هەر هەمووی بەلامەوە رەفز كراوە و رەتكراوەیە تەنها الله نەبێ .

ئەگەر ئەوە نەلێت و لەمالی خۆت دابنیشی نوێژ و عیبادەت بكەی بلێ من بەس نوێژ و عیبادەت دەكەم و هیچ پەیوەندیم بەخەلكەوە نیە وە خەلكیش بەكافر دانانێم كە الله و پێغەمبەرەكەی (صلى الله علیه وسلم) بەكافریان داناوە ، زانایان دەفەرموون : بەم ئایەتە تۆ كافری . چونكە تۆ ئەبێت كافر بەكافر دابنێ ،ئەبێت بەكافر بلێت كافر نابێت بلێت من پەیوەندیم نیە .

نوكتەیەك ئەگێرنەوە ئەلێن : كەسێك چوو بۆ حەج شەیطانیان رەجم ئەكرد وە لەو خەلك وا دەلێ بەس ئێمە ئەلێن ئەمە شەعیرەیە و دەكرێی ئەبێت ئەو بەردە بگریتە ئەم شوێنە و تەواو لەلای خەلك واباسە كە ئەمە شەیطان رەجم ئەكرێ ، كەسەكەش وتی شەیطان گیان من والله عەداوەتم لەگەل تۆ نیە بەس ئەمانە وا ئەكەن منیش وەكو ئەمانە دەكەم هیچ پەیوەندیم بەو بابەتەوە نیە !.

[٣٢] سورة البقرة اية : ٢٥٦

ئێستاش خەلکی وایە ئەوە خەلك نوێژ ئەکا منیش نوێژ ئەکەم تەواو ئیتر پەیوەندیم بە بابەتەکانیترەوە نیە لەبەر ئەوە الله تعالی وا نالێت لەقورئانی پیرۆز دەفەرمووی : (فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ)بەمەرجی گرتوە ئەبێ تۆ کوفر بەطاغوت بکەی ، سەیرکەن (يَكْفُرْ)واتا تۆ ئەبێت تەکفیری بیت تۆ ئەبێت بەکافری دانبێ کەسێك کە الله نەپەرستێ یاخود الله بپەرستێ لەگەل الله کەسێك و شتێکیتریش بپەرستێ و عیبادەتی بۆ بکا ، ئەگەر بلێت ئەو کەسە کافر نیە تۆ خۆت کافری چونکە الله بەدرۆ ئەخەیتەوە جل وعلا .

الله تعالی دەلێت :ئەوەی وا بکا کافرە تۆش ئەلێت کافر نیە کەواتە لێرەدا تۆ کافر بووی .

ئێمە ئێستا ئیمانمان بەم شێوەیەیە : ئیمانمان بە الله و بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەیە وە بروامان هەیە کە دینێکی راستمان هەیە کە لەقورئان هاتووە باقی دینەکانیتر ، یەهودی بێت یاخود نەصرانی والله عیسا و موسا ئێستا لەژیاندا بن بەتەوارت و ئینجیل کار بکەن کافرن ! بەنەصی قورئان ئەمە وتەی من نیە پێغەمبەر وای فەرمووە (صلی الله علیه وسلم) ئەمە نەصی قورئانە . الله تعالی وەعدی لێوەرگرتوە لەقورئان لێیان موسا و عیسا و فلان و فلان کە محمد هات ئەبێ هەمووتان دەست بەرداری شەریعەتەکەتان بن وەرن بۆ لای محمد (صلی الله علیه وسلم)ئەگەر نا هەمووتان کافرن جا ئەلێن بەلێ یا الله ئێمە ئیقرارمان کرد .

تخوا موسا و عیسا کافر بێ لەلای الله تخوا ئەو ئینسانە هیچ و پوچەی ئەمرۆ جوێن بە الله و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) و دینەکەی ئەدا بۆ کافر نەبێ !! بەس بەمن بلێن ئاخر بۆ ! یانی تۆ لە الله بەرەحمتریی ! نەخێر لەلای خەلکی هەموو دونیا موسلمانە ، هەتاوەکو مەلا هەیە ئەلێ یەهودی و نەصرانی کاکە خوا ئەپەرستی ئەوپش موسلمانە ! دیارە زۆر بێ عەقلی لەقورئانەکە تێ ناگەی کە الله تعالی چی دەفەرمووێ ،

الله تعالی دەفەرمووی : (لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ )[٣٣] والله کافرە ئەوەی بلێ خوا سێیانە ، ئەی هەموو جاری واناکەن نالێن سێ یانە ! .

---

[٣٣] :سورة المائدة اية : ٧٣

## کۆتایی :

کۆتاییمان بەوە دەهێنن کە تۆ هەتاوەکو شەو رۆژ ئەم مەرجانە بخوێنیتەوە بەراستی نرخی لەکەم بوون نیە هەر لەزیاد بوونە ئەبێ باش ئاگادار بیت لێشی بێ تاقەت نەبی چونکە هەموو قورئانەکەی تۆ لەسەر ئەمەیە وە هەموو قورئانەکەت بۆ ئەمە هاتووە وە هەموو جن و ئینس بۆ ئەمە دروستکراوە خۆشەویستانم .

(وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين)